# پەیڤەکانی ڕێبەرێک

پەیڤەکانی ڕێبەرێک کە بۆ گەل ژیا و بۆ گەل مرد

پەیڤەکانی شەهید د. عەبدولڕەحمان قاسملو



ئامادەکردنی :

ئاگری باڵەکی

**ناوی کتێب:** پەیڤەکانی شەهید د. عەبدولڕەحمان قاسملوو

**ئامادەکردنی:** ئاگری باڵەکی

**بڵاوکردنەوەی:** هاوینی ٢٠١١

## سەرچاوە:

. ماڵپەرەی گیارەنگ

. ماڵپەری کوردستان و کورد

١ .کتێبی «کورتەباس» ( نامیلکەی کورتەباسێك لە سەر سۆسیالیزم و شی کردنەوەی کورتەباس )،
نووسینی : دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو
ئامادە کردنی بۆ چاپ : سەلاح شەشە ، سوئێد. بەفرانباری ٢٠٠٣

٢.چەند ژمارەی « کورستان « ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران.

٣.نامیلکەی « ڕەوتی ئاشتی و دێمۆکراتیزاسیۆن « پاشکۆی « تێکۆشەر « ی ژمارە ٢٦( دەقی باسێك کە دوکتور قاسملوو لە سمینارێکی حیزبی دا ، پێشکێشی کردوە.)

ئەم بابەتە لە ژمارە ٣٩٢ی ڕۆژنامەی «کوردستان» ، ٨ی ژوئیەی ٢٠٠٤ دا بلاو بۆتەوە.

## ووتەیەکی کورت:

ئەم نامیلکەیە کە لەبەر دەستتان دایە ، هەوڵێکی دیکەیە بۆ گەیاندنی ئامۆژگارییەکانی ڕێبەرێک کە بۆ گەل ژیا و بۆ گەل مرد. ئەم پەیڤانەی کە کۆمەڵێکی بچوکن لە سەدان پەیڤی تر ، کە لە لاپەرە و کاسێتەکان دا ماون بەڵام وەک سەرەتایەک بۆ کارێکی گەورە دەستپێکێکی باشە ، هیوادارم کە نەوەی داهاتوو ئەگەر تاکو ئیستاش نەیتوانیوە کەڵکی باش لە ووتە باشەکان وەربگرێ هیوادارم لە داهاتوودا بیانکاتە سەر مەشقی ژیانی خۆیان ، لانیکەم نەوەی تازە بزانێت کە ڕێبەرانمان لە پێشوادا چیان گوتووە بتوانن ئەم پەیڤانە بە باشترین شێوە کەڵک لێ وەربگرن و گەورەیی د. قاسملوو لە پەیڤەکانیدا ببینەوە.

دواشم لەهەر بەڕێزێک هەیە کە تێبینی هەیە بتوانێ ڕێنوێنیم بکات بۆئەوەی لە کاری داهاتوو و دەوڵەمەند کردنی ئەم نامیلکیە تێبینیەکەی وەبەر چاو بگرم.

ئاگری باڵەکی
هاوینی ٢٠١١

# گەلێک ئازادیی بوێ دەبێ نرخی ئەو ئازادییەش بدا

گەلێک ئازادیی بوێ دەبێ نرخی ئەو ئازادییەش بدا. هیچ میللەتێک بە بێ زەحمەت‌و تێکۆشان، بە بێ بەختکردنی رۆڵە بە نرخەکانی خۆی بە ئازادی نەگەیشتوە.

گەلی کوردیش‌و حیزبی ئێمەش کە پێشڕەوی خەباتی گەلی کوردە لەمێژە ئەوەی دەزانن کە ئازادی، فیداکاریی دەوێ، خۆبەختکردنی دەوێ. کاروانی شەهیدانمان درێژە، بەڵام رەنگە لەوەش درێژتر بێ.

ئێمە لە رۆژی شەهید بوونی شەهیدەکانمان لەمێژە بڕیارمان داوە نەگرین. لەمێژە بڕیارمان داوە کە تەنیاو تەنیا کارێک کە دەتوانین بکەین‌و لەبەرچاو و لەبەر بیری شەهیدانمان شەرمەزار نەبین ئەوەیە کە رێگای ئەوان بەرنەدەین، وەک ئەوان تا سەر ئەو رێگایە بڕۆین، لە هیچ تەنگ‌و چەڵەمەیەک نەترسێین، لە هیچ سەختی یەک نەکشێینەوە.

خەباتی ئێمە خەباتێکی رەوایە.خەبات بۆ ئازادیی میللەتێکە، خەبات بۆ دوارۆژی منداڵەکان‌و نەسلەکانی دیکەیە. ئەگەر ئێمە وەک ئەم نەسلە ئەرکی خۆمان بە چاکی بەجێ بگەیەنین دەتوانین هیوادار بین کە نەسلی داهاتوومان شەهیدی نەبێ. هەروەها ئەگەر نەسلی رابردوو یا نەسلەکانی رابردوو بە چاکی ئەرکی خۆیان بەجێ هێنابا رەنگ بێ ئەو نەسلەی ئێمە شەهیدی نەدەبوو.

بۆیە بیرەوەریی شەهیدەکانمان جارێکی دیکە دەمان هێنێتە سەر ئەو بڕوایە کە بە بیروباوەڕێکی چەسپاو، بە دڵێکی پڕ لە شۆڕش‌و بە هیوایەکی زۆر، خەباتی خۆمان درێژە پێ‌بدەین. ئەو خەباتە ئاکامی دەبێتە دوو شت: هەم گیانی شەهیدەکانمان شاد دەکاو هەم میللەتەکەمان رزگار دەکا بۆ ئەوە لە دوارۆژدا شەهیدمان نەبێ.

*ئەم وتانە لە رێورەسمی پرسەو سەرەخۆشیی پێشمەرگەوئەندامی لەمێژینەی حیزب کاک خالیدی عەلیپوور دا (زستانی ١٣٦٧) پێشکەش کراون.*

# ڕادەی بەشداربوونی ژنان لە هەموو بارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسی دا ، نیشانە ڕادەی پێشکەوتوویی هەر کۆمەڵێکە

ژنان نیوەی ئەندامانی کۆمەڵن. هەرچی کەمتر لە کاروباری کۆمەڵدا بەشدار بن، ئەوەندە کارو تێکۆشانو خەللاقییەت لە کۆمەڵدا کەمترەو هەر ئەوەندەش کۆمەڵ پاشکەوتووترە. بۆیە ڕادەی بەشداربوونی ژنان لە هەموو بارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسی دا، نیشانە ڕادەی پێشکەوتوویی هەر کۆمەڵێکە. ئەوە لە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەش دا هەر ڕاستە. هەرچی ژنان بەرینترو چالاکتر تێی دا بەشدار بن، ئەوەندە بزووتنەوە پێشکەوتووانەترو سەرکەوتووترە.

... بۆ ئەم مەبەستە دەبێ هەر نەبێ لە سێ بەرەدا خەبات بکەین. خەبات بکەین بۆ لابردنی پاشکەوتنی گشتیی وڵاتەکەمان کە هۆی ئەسڵیی پاشکەوتنی ژنانیشە. تێبکۆشین دژی هەموو دابو شوێنی کۆنەپەرستانە کە ژن لەگەڵ پیاو بە یەک مافو یەکسان سەیر ناکەن. خەبات بکەین دژی شێوەی بیرکردنەوەی پاشکەوتووانەی پیاوان کە چەوساندنەوەی ژنان لە نێو خۆیان دا بە کارێکی بەجێ دەزانن. تێبکۆشین دژی خۆکەم بینیو لە خۆ دڵنیا نەبوونی ژنان، کە ستەمی کۆمەڵو خێزان دژی خۆیان بە دیاردەیەکی ئاساییو ڕەوا دادەنێنو لە بەرامبەریدا تەسلیم دەبن.

*لە پەیامی دوکتور قاسملووی نەمر بەبۆنەی ٨ی مارسی ١٩٨٧*

# سەبارەت بە مەسەلەی ژنان

لە تێکۆشانی حیزبی و سیاسیی ئێمە دا، دەبێ جێگایەکی تایبەت بدرێ بە ژنان کە نیوەی دانیشتووانی وڵاتەکەمان پێک دێنن. وەک دەزانن حیزبی ئێمە مافی بەرابەریی تەواو لەگەڵ پیاوان بۆ ژنان دادەنێ. بەڵام دانانی ماف لە گەڵ پیادە کردنی ئەو مافە لە کۆمەڵ دا مەودایەکی زۆریان لە بەین دا هەیە. دەبێ ئەو مەودایە بەرە بەرە لە بەین بچێ. بە بیر و ڕای حیزبی ئێمە هەرچی ژنان لە کارە کۆمەڵاتی و سیاسی یەکان دا بەشدار بن کۆمەڵ پێشکەوتووترە و، هەرچی لە بزووتنەوەی سیاسیی نەتەوەیەک دا ژنان تێکۆشەرتر بن، بزووتنەوەکە پێشکەوتووترە و شانسی سەرکەوتنی زیاترە.

# خەبات دژی ستەم ،
# مەسەلەی بنەڕەتی لە ژیانی دوکتور قاسملوودا

**لەماوەی ساڵانی تێکۆشاندا چ ئاڵوگۆڕێك لە خۆتدا پێك هاتوە؟**

دوکتور قاسملوو: مەسەلەیەکی بنەڕەتی بۆ من کە هەر لە سەرەتای لاوەتی‌یەوە خەباتم بۆ کردوە، مەسەلەی لەنێو بردنی ستەم بووە. لەو مەسەلە بنەڕەتی‌یەدا ئاڵوگۆڕێکم تێدا پێک نەهاتوە. دیارە ئەزموونێکی زیاترم لە ژیانی سیاسیمدا وەسەریەک ناوەو واقیع بینتر بووم یا هەر بەگشتی واقیع بینتر بووم. من لە ژیانمدا هەمیشە خۆشبین بوومو لە سەختترین هەلومەرجەکانیش‌دا هەمیشە روحیەی خۆم پاراستوە. ئێستاش هەر وام. زۆر ئۆگری خوێندنەوەم. هەموو گۆڤارەکان، ڕۆژنامە خاریجی‌و ئێرانی‌یەکان لە کوردستان دەخوێنمەوەو زۆریش ئۆگری خوێندنەوەی ڕۆمان‌و کتێبە زانســـتی‌یەکانم. بەڵام شێعرم زۆر خۆش دەوێ. لە کوردستان شەوی شێعر پێک دێنین‌و منیش شێعر ]لەو شەوە شێعرانەدا[ دەخوێنمەوە. عەلاقەیەکی یەکجار زۆرم بە شێعری کلاسیکی ئێران هەیە ]بە شێعری[ حافزو سەعدی‌و خەییامو بابا تاهیری عوریان‌و فیردەوسی. هەروەها بە شێعری کلاسیکی کوردی بەتایبەتی بە شێعری گۆران کە شاعیری سەدەی بیستەمی کوردستانەو بە شێعری ئەحمەدی خانی کە شاعیری کلاسیکی کوردە. لە شاعیرە نوێ‌یەکان دیارە نادر نادرپوورو ئەحمەدی شاملووم بە دڵن. دیوانی ئەوانم هەن‌و پەروینی ئیعتیسامییشم زۆر خۆش دەوێ. وا بیر دەکەمەوە کە شێعرەکانی زۆر لە ژیانی من لە هەلومەرجی ئێستادا نزیکن.

دیارە دەزانن کە خەباتی سیاســـی بەتایبەتی کە تۆ بەرپرســـیش بی‌و شـــەڕی نێوخۆییش لە گۆڕێ بێ، گیروگرفتت بۆ دێنێتە پێش کە بە داخەوە ناتوانی بە شێوەیەکی سیستماتیک بپرژێیە سەر ئۆگریی خۆت بە شێعر یا موسیقا. یەکێک لە گیروگرفتەکانی ژیانی من مەسەلەی شەهید بوونی هاوڕێیانی نزیکمە. ئەوە یەکێک لە گەورەترین ناڕەحەتی‌یەکانی ژیانمە. ئەگەر ئێســـتا بم توانیبایە بۆخۆم بڕیار بدەم، حەزم دەکرد خەریکی زانست بامو خۆم بە مەسەلە فەرهەنگی‌یەکان‌و ئەدەبیاتەوە خەریک بکەم. بەڵام ئەوەکە ئێستا لە کوردستانم، بە ئەرکی خۆمی دەزانم، چونکە هەست بە بەرپرسایەتی دەکەم لەبەرامبەر خەڵکی کوردستان‌و خەڵکی ئێران‌دا.

**پرسیارێکی دیکەت لێ دەکەم، ئەویش ئەوەیە پێت وایە ١٠، ١٥، ٢٠ ساڵی دیکە خەریکی چ کارێك بی‌و لە کوێ بی؟**

دوکتور قاسملوو: من ناتوانم پێش بینی بکەم. لەو هەلومەرجەی ئێمە تێیّ داین هەر پێش بینیی شتی وا زۆر سەختە. من حەز دەکەم پاش چەند ]ین[ ساڵ، ئەگەر بتوانم خەریکی کاری زانستی‌و نووسین بم. ئێستا نزیکەی ٤٠ ساڵە لە خەباتدا بەشدارم. حەز دەکەم ئەزموونەکانی خۆم بنووسمەوە. بەڵام لە هەر حاڵدا پێم خۆشە لەنێو خەڵک‌دا بمو ئێستا وا ڕاهاتووم کە لە هەلومەرجی ئێستادا دووری لە خەڵک زۆر سەختە. هیوادارم هەلومەرجێک بێتە پێش کە وڵاتەکەمان ببێتە وڵاتێکی سەربەخۆو هێمن‌و لە هەلومەرجێکی ئاوادا، من لە یەکێک لە گوندەکانی کوردستان، لەوانەیە لە گوندی «قاسملوو» ـ ڕەنگە ئێوە نەزانن کە دێ یەک بەو ناوە هەیەو من ناوی خۆم لەو وەرگرتوە ـ لە دێی قاسملوو دابنیشمو تا کۆتایی تەمەن بخوێنمەوەو بنووسم.

*لە وتووێژی «بهروز یوسف زاد» لەگەڵ شەهیدی نەمر دوکتور قاسملو (لە نێوەڕاستەکانی دەیەی ٦٠ی هەتاوی‌دا)، ڕادیۆی B.B.C، بەرنامەی «جام جهان نما» ١٣٦٧/٤/٢٣*

# دێموکراسی و مافە نەتەوایەتی یەکانی گەلانی ئێران

پاراستنی ئازادی یە دێموکڕاتی یەکان و چەسپاندن و پتەو کردنی بناخەی ڕێژیمێکی ڕاستەقینە لە سەرانسەری ئێران دا، زامنی ئەسلیی پێشکەوتنی شۆڕش و وەدەستهێنانی مافە نەتەوایەتی یەکانی هەموو گەلانی ئێرانە. بێ بوونی ڕێژیمێکی دێموکڕاتی ڕاستەقینە مافەکانی گەلی کورد دابین ناکرێ و بە بێ دابین بوونی مافی نەتەوایەتیی گەلی کوردیش ڕێژیم بە مانای تەواوی وشە دێموکڕاتیک نابێ. ئەگەر دوژمنانی گەلی کوردیش پێیان وایە بە سازکردنی بەیت و باوی جیاوازیخوازی دەتوانن گەلی کورد ناچار بکەن حاڵەتی دیفاعی بە خۆیەوە بگرێ و داوای مافە ڕەواکانی نەکا زۆر بە هەڵە چوون. ئێمە دڵنیاین هیچ ڕێژیمێک لە ئێران دا ڕێژیمێکی بە ڕاستی گەلی، دادپەروەر و دێموکڕاتیک نابێ ئەگەر نەتوانێ مەسەلەی نەتەوایەتی کە یەکێک لە گیروگرفتە بنەڕەتی یەکانی وڵاتی ئێمەیە چارەسەر بکا. ڕاستی یەکەی ئەوەیە کە لە ئێران دا گەلانی زۆرلێکراو زیاتر لە نیوەی دانیشتووانی وڵات پێک دێنن. خوێندن بە زمانی زگماکی، پاراستن و پەرە پێدانی فەرهەنگی نەتەوایەتی، لابردنی جیاوازیدانانی ئابووری و سیاسی و لە هەمووی گرینگتر دیاریکردنی چارەنووس بە دەستی خۆیان بە شێک لە مافە ڕەواکانی ئەو گەلانەن، لابردنی ستەمی نەتەوایەتی لە سەر ئەو گەلانە بە پێچەوانەی ئیددیعای ژمارەیەک لە دوژمنانی خەڵک هاندان بۆ جیا بوونەوە نیە، بە پێچەوانە دابین کردنی یەکیەتیی ڕاستەقینەی ئەو گەلانە لە چوار چێوەی ئێرانێکی دێموکڕاتی دا، زامنی پاراستنی یەکیەتی و سەربەخۆیی وڵاتە. مەسەلەی نەتەوایەتی لە ئێران دا هەیە و هیچ چەشنە خۆ گێل کردنێک لە بایەخی ئەو کەم ناکاتەوە، بە پێچەوانە ڕێگا بۆ کەڵکوەرگرتنی دوژمنانی ئازادی و سەربەخۆیی ئێران خۆش دەکا.

# یەکیەتیی سیاسی و فیکری

پتەو کردنی یەکیەتیی سیاسی و فیکری ئەرکێکی بنەڕەتی یە کە دەکەوێتە سەر شانی هەموو ڕێکخراوەکانی حیزب. دیارە هەموو ئەندامانی حیزب لە بارەی مەسەلە سیاسی یەکانەوە وەک یەک فکر ناکەنەوە، ئامانجیش ئەوە نیە وەک یەک فکر بکەنەوە. چونکە ئەوە نە مومکینە و نە بە قازانجی تێکۆشانی حیزبیشە، مەبەست لەو یەکیەتی یە ئەستاندنەوەی داهێنانی فیکری لە ئەندامانی حیزبی نیە. بوونی بیروڕای جیاواز و ڕێککەوتنی دێموکڕاتیکی ئەوان کلیلی چارەسەر کردنی دروستی گیر و گرفتەکان و هۆی بەرەو پێشچوونی حیزبە.

## ڕەمزی خۆڕاگریی حیزبی دێموکڕات

بۆ چی حیزبی دێموکڕات توانیویەتی ڕابوەستێ، ئەوانی دیکە نەیانتوانیوە ؟ ئەوە سێ هۆی هەیە : یەکەم، سیاسەتی حیزبی دێموکڕات، سیاسەتێکی دروست بووە. بۆ داخوازەکانی خەڵکی کوردستان کە بریتین لە دێموکڕاسی و خودموختاری خەبات دەکەین. ئێمە شوعاری خۆڕاییمان نەداوە، شوعاری توند و تیژمان نەداوە، کە بۆمان جێ بە جێ نەکرێن. ئێمە مەسئوولانە هەتا ئێستا چووینە پێش. وەختی ئاشتی ویستوومانە وتووێژ بکەین و وەختی شەڕ شەڕمان کردوە. دووهەم، خەڵکی کوردستانی ئێران پشتیوانی ئێمەیە. حیزبی دێموکڕات وەک ماسی یەک لە نێو گۆم دایە، گۆمەکەش خەڵکە. هێزی حیزبی دێموکڕات لە وە دایە کە خەڵک پشتیوانی لێ دەکا. سێهەم هۆی مانەوەی خەباتی ئێمە فیداکاریی پێشمەرگەکانمان بووە.

## نەخشی دانیشتووانی شار لە بزووتنەوە دا

شارەکانی کوردستان پشتی جەبهەی دوژمنن، کەوابوو لە شارەکانی کوردستان دەکرێ زۆر زەربەی باش لە دوژمن بدرێ.دەبێ هەموو کارەکانی دوژمن بۆ ئەوەی پشتی جەبهەی خۆی بە قەوەت بکا، تێک بدەین. دوژمن تەداروکاتی لە شارەکانەوەیە، دوژمن هێزی خۆی لە شارەکان کۆ دەکاتەوە. دوژمن ئازووقەی لە وێ را دێت. دەبێ کارێکی وا بکەبن نەک هەر لە دەرەوەی شار کە پێشمەرگەی لێ یە و ڕێگای لێ دەگرێ و زەربەی لێ دەدا، بەڵکوو لە داخیلی شاریش دا بە ئیبتکاری دانیشتووانی شارەکانی کوردستان دەبێ زەربەی لێ بدرێ. نابێ لە بیریان بچێ کە هەرچەند ئەوان لە شارەکانن و هەرچەند بە زاهیر چەکیان پێ نیە، بەڵام پێشمەرگەن، وەک پێشمەرگە لە سەنگەر دان و دەبێ بۆ تێکدانی نەخشەکانی دوژمن، بو گەیاندنی ئەخبار بە پێشمەرگە و بو بەربەست کردنی ڕێگای دوژمن لە هەر ڕێگایەکەوە و بە هەرشێوەیەکی بتوانن ئەرکی خۆیان جێ بە جێ بکەن.

# مەسەلەی کورد
# مەسەلەیەکی نێوخۆیی نیە

مەسەلەی کورد لە هەموو ئەبعادی خۆی دا بەو شێوەیە کە هەیە لە واقیع دا مەسەلەی **٢٥** میلیۆن کوردە کە دەبێ مەترەح بکرێ. پێم وایە ئەگەر بەو شێوەیە بچینە پێش سەرکەوتنمان زیاتر دەبێ، موهیممیش ئەوەیە کە ئەو پەیامە کە لەو وەزعە تازە دا دەینێرین پەیامێک بێ کە باش لە دەرەوە وەربگیرێ. دەبێ بە هەموو ئەو کەسانە کە گوێیان لە قسەکانی ئێمەیە بڵێین کە داوای کورد زۆر سادە و رەوایە. کورد مافی نەتەوەیی خۆی دەوێ، کە لە بەیاننامەی جیهانیی مافی ئادەمیزاد دا هاتوە. واتە شتێکی زیادی نیە، بۆیە مەسەلەن داوای خودموختاری مەسەلەیەکی نێوخۆیی نیە. زۆر لە دەوڵەتان وەک دەوڵەتی ئێران ئەگەر باسی خودموختاری دەکرێ دەڵێن : ئەوە مەسەلەیەکی داخیلی یە کەس حەقی نیە دەستی تێوەردا. کەوابوو مەسەلەی خودموختاری مەسەلەیەکی نێو خۆیی نیە و بەشێکە لە مافی ئادەمیزاد. بۆیەش ئەو دەوڵەت و رێکخراو و شەخسییەتانە کە خۆیان بە لایەنگری مافی ئینسان دەزانن پێویستە کە لە داوا رەواکانی گەلی کورد پشتیوانی بکەن.

# روو لە گەلانی ئێران

پێم خۆش بوو چەند کەلیمەش لە گەڵ گەلانی بەشەکانی دیکەی ئێران بدوێم. ئێوە دەبێ بزانن کە کوردستان تەنیا بۆ خودموختاری شەڕ ناکا، بەڵکوو بۆ ئازادیی سەرانسەریی ئێران خەبات دەکا. کوردستان لە پێناوی رزگاریی هەموو ئێران لە ئیستیبدادی ئاخوندی یە کە شەهید دەدا. بۆیە ئەرکی سەشانی هەموو شۆڕشگێڕان و ئازادیخوازانی ئێرانە کە یارمەتیمان بدەن. ئێمە دەزانین کە رێژیمی سەرکوتکەر رێگاتان نادا کە یارمەتیمان بدەن، بەڵام رێژیم ئەوەندەش بە هێز نیە کە کاربەدەستانی ئیدیعا دەکەن. رێگای یارمەتیدان بە کوردستانی خوێناوی ئاواڵەیە. لە بیرتان نەچێ کە یارمەتیدان بە کوردستان، یارمەتیدان بە سەنگەری لە گیران نەهاتووی سەرانسەری ئێرانە.

## ئەخلاق لە سیاسەت دا

ئێمە بێ ئوسولی و جنێو فرۆشی لە سیاسەت دا ڕەت دەکەینەوە، بۆ جێگیر کردنی ئەخلاق لە سیاســەت دا تێ دەکۆشــین و یەکەم ڕێکخراوی ئێرانی بووین کە ئەخلاقمان واریدی سیاسەت کردوە.

## دیکتاتۆری ، مەحکووم بە نەمانە

سەرکەوتن بە سەر فاشیزم دا زۆر دەرسی بە نرخی تێدان، یەکەم : ئەوەی کە دیکتاتۆری یەکان هەرچەند بە هێزیش بن ئاخرەکەی لە بەرامبەر ڕاوەستانی گــەلان دا هێزی خۆڕاگرتنیان نیە و دەڕووخێن، دووهەم : شــەڕ خوازی بە مەبەســتی لە ژێر چۆک خستنی گەلان یا سادر کردنی ڕێژیمێکی دیاریکراو، ئەنجامێکی بێجگە لە شکست و لە نێوچوونی خۆی بەدواوە نیە .

## ڕەت کردنەوەی تیرۆریزم

ئێمە وەک حیزبی دێموکڕات ڕەشە کوژی ڕەت دەکەینەوە. چونکە حیزبێک لە لایەن گەلەوە پشتیوانیی لێ بکرێ هیچ پێویستی یەکی بۆ پەنا بردن بەو چەشنە کارانە نیە. ئێمە تیرۆریزم لە هەر شوێنێک مەحکووم دەکەین.

# خەباتی فەرهەنگی و نەتەوەیی

ژیانــی فەرهەنگیی خەڵکی کوردســتان لە حاڵی پێشــکەوتن و بووژانەوە دایە، پێشکەوتن و پشکووتنی فەرهەنگ، جووڵانەوەی ڕزگاریخوازیی ئێمە بە هێز دەکا و ئەویش لە بەرامبەر دا شــوێن دادەنێتە سەر بووژانەوەی فەرهەنگ. تەنانەت ئەگەر بڵێین شــوێنەواری ئەم دوو دیاردەیە لە سەر یەکتر شوێنەوارێکی ڕاستەوخۆیە هیچ موبالیغەمان نەکردوە. بۆ سەلماندنی ئەم ئیددیعایە دوو بەڵگە لە دەست دایە. یەکەم ئەوە کە خەباتی ئێمە خەباتێکی نەتەوەیی یە. خەڵکی ژێرستەمی ئێمە کە بۆ دیفاع لە مانەوەی خۆی شەڕێکی چەکدارانەی دەست پێکردوە، هەر لەو کاتەش دا ئەرکی سەرشانیەتی کە فەرهەنگی نەتەوەیی خۆی بپارێزێ و بیبووژێنێتەوە. دووهەم : ئەوە کە ئەمڕۆ ئێمە لە کوردستان دا لە گەڵ ڕێژیمێکی یەکجار زۆر دواکەوتوو، ڕێژیمی ئایەتوڵڵاکان کەلە تاریکایی چەرخەکانی نێوەڕاســتەوە هاتوون، ڕووبەڕووین. شەڕی ئێمە لە دژی ڕێژیمی نەزانی و خورافات پەرستی درێژەی هەیە، هەم لە بەرەی شەڕ دا و هەم لە مەیدانی فەرهەنگ و پەروەردە و فێرکردن دا. ئەم دوو دیاردەیە پێکەوە گرێ دراون. دیاردەی یەکەم بە بێ دووهەم سەر کەوتوو نابێ،دووهەمیش بێ یەکەم ناتوانێ وجوودی هەبێ.

# سەر بە خۆیی سیاسی

ئێمە حیزبێکی سەربەخۆین و سەربەخۆیی خۆمان لە هەموو شتێکی دیکە خۆشتر دەوێ. ئەوەی بۆ خۆمانی بە قازانج بزانین جێ بە جێی دەکەین. هیچ کەس ناتوانێ نەزەری خۆی بە سەر ئێمە دا بسەپێنێ و تا ئێستاش هیچ کەس نەزەری خۆی بە سەر ئیمە دا نەسەپاندوە.

# تیرۆریزمی دەوڵەتی

لە رابردوو دا دەوڵەتەکان بە شـــێوەیەکی گشـــتی لە پشـــتیوانی کردن لە ئاکار و کردەوەی تیرۆریستی خۆیان پاراستوە و بە دایم لە دڵەخورپە دا بوون کە نەکا وەک پشتیوان و لایەنگری تیرۆریزم کە ئەو پەڕی قانوون شکێنی و تێکدانی داب و نەریتی نێونەتەوەیی یە بناسرێن و بە لایەنگری لە تیرۆریزم تاوانبار بکرێن. بەڵام لە حاڵی حازر دا وای لێ هاتوە کە رێژیمە دیکتاتۆرەکان لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجەکانیان دا نە تەنیا کردەوەی تیرۆریستی بە خراپ نازانن، بەڵکوو بە راشکاوی و بە شێوەی رەسمی لە نێو خۆ و دەرەوەی وڵات دا لە رەشەکوژی و شێوە جۆراوجۆرەکانی تیرۆر کەلک وەردەگرن.ئەم رێژیمانە لە نێو خۆی وڵات دا موخالیفە سیاسی یەکانی خۆیان تیرۆر دەکەن و لەو رێگایەوە دەسەڵاتی پاوانخوازانەی خۆیان بە زۆری بە سەر خەڵک دا دەسەپێنن. لە دەرەوەی وڵاتیش بۆ کپ کردنی دەنگی هاودەردی و هاوپێوەندیی جیهانی و بۆ بەرگری لە لایەنگریی ئازادیخوازان و بە مەبەستی ناچار کردنی دەوڵەتان بۆ قەبووڵی هێندێک مەبەستی تایبەتی و جاروباریش بۆ باج ئەستاندن یان سەپاندنی ئیدئۆلۆژی و بۆچوونی تایبەتیی خۆیان پەنا دەبەنە بەر تیرۆریزم.

## گرنگیی تەشکیلات

بە بێ بوونی تەشکیلاتی حیزبی، هێزی بێ پایانی خەڵک وەک ئینێرژی‌یەکی دەست لێ نەدراو دەمێنیتەوە، ئەگەر چی بە شێوەی خۆبەخۆ حەرەکەت لە خۆی نیشان دەدا، بەڵام کاریگەر نابێ، دوژمن زەبری لێ دەدا و بە چووکی دادێنێ. ئەوە ڕاستی یەکی مێژوویی یە و لە جووڵانەوەکانی ڕابردووی گەلی کورد دا نەبوونی تەشکیلات وەک ئاوێنەیەک خۆ دەنوێنی کە هۆی تێکشکان و ناکامی یەکانە.

## دێمۆکراسی

هەرگیز خەبات بۆ دێموکڕاسی نابێ بچێتە ژێر سێبەری خەبات بۆ مافی نەتەوایەتی یا خەباتی چینایەتی. چونکە ئەوە هۆی بنەڕەتیی پێکهاتنی حیزبی دێموکڕاتە و تا حیزبی دێموکڕات ماوە دێموکڕاسی مەبەست و ئامانجیەتی .

## مودیرییەت

شێوەی مودیرییەت لە حیزبی ئێمە دا بە گشتی لە سەر بناخەی پێوەندیی زیندوو، ڕێنوێنی و لە ئاکام دا ئیقناعە. بەرپرسی حیزبی دەبێ ڕێنوێنی و بڕیارەکان کە لە بەخشنامەدا دەدا، دەبێ پێوەندیی زیندووی لە گەڵ نەفەراتی خۆی هەبێ و تەوزیح بدا و ماندوو نەبێ تا ئەو کاتەی تەرەف قانع دەکا.

## ڕەفتاری دروستی حیزبی

ئەوەش ئەسڵێکی گرنگی دیکەی مودیرییەتە کە بەرپرسی حیزبی دەبێ بزانێ چۆن هەڵسوکەوت لە گەڵ ئەفرادی سەرەوە و ئۆرگانی سەرەوە بکات و لە هەمان کات دا بشزانێ کە چۆن بەرخورد لە گەڵ ئەفراد و ئۆرگانەکانی خوارەوە بکات. شێوەی ئوسوولی ئەوەیە کە نابێ بە تەحەککوم و دەستوردان و توند و تیژی و کوێخایانە ڕەفتار لە گەڵ ئۆرگانەکانی خوارەوە دا بکەین و لە گەڵ ئۆرگانەکانی سەرەوەش نابێ ڕەفتارمان چاپلووسی و تەمەللوق و پێدا هەڵکوتن بێ.

## ئەوینی نیشتمان

من بە ڕاستی زۆر خۆشحاڵم کە جارێکی دیکە لە نێو خەڵکی خۆمان و ئەندامانی حیزب و پێشمەرگە دام . وڵاتی دیکە زۆر خۆشن، زۆر جێگای خۆشیش لەو دنیایە دا هەیە. بەڵام بۆ من هیچیان بە قەد نیشتمانی خۆمان خۆش نین و هەموو جارێک کە دەگەڕێمەوە هەست بە خۆشحاڵی یەکی یەکجار زۆر دەکەم و، کە دەگاتە ڕۆژەکانی ئاخری سەفەرەکەم کەمێکیش بە پەلەم کە هەرچی زووتر بگەڕێمەوە نێو هاوڕێیان و پێشمەرگەکان و گەلی خۆمان.

## پێوەندی لە گەڵ گەلانی دیکەی ئێران

سەدان ساڵە کە خەڵکی کوردستان لە گەڵ گەلانی دیکەی ئێران پێکەوە دەژین. ئێمە خۆمان بە ئێرانی دەزانین و بەو کەسانە کە جاروبار لێرو لەوێ ئێمە بە جیاوازیخواز ( تەجزییە تەڵەب ) دادەنێن دەڵێین : بە هیچ جۆر ئەو حەقە بە هیچ کەس نادەین کە خۆی لە ئێمە بە ئێرانیتر بزانێ.

## دیفاعی مەشرووع

بە پێچەوانەی تەبلیغاتی دوژمنانی نەتەوەی کورد، کوردەکان شەڕ خواز نین، ئەوان خوازیاری سوڵح و ئاشتین، بەڵام کاتێک بوون و مەوجوودییەتیان وەک نەتەوەیەک لە مەترسی دەکەوێ، دیارە بۆ دیفاع لە هوویەتی میللی و شەخسییەتی ئینسانیی خۆیان ناچارن ڕاپەڕن.

## دادپەروەریی کۆمەڵایەتی

وەدەستهێنانی خودموختاری بێ لە نێو بردنی هەژاری و کوێرەوەری، دەبێتە داخوازێکی بێ نێوەرۆک.

*ئەم وتانە کە لە سەرچاوەی جۆراوجۆر دەرم هێناون تا تێرە لە ژمارە ١٨٧ی «کوردستان»، پووشپەڕی ١٣٧١ (ژوئیەی١٩٩٢)دا بلاو بوونەوە.*

## شانازی یەکی گەورە بۆ حیزبی دێمۆکرات

دەتوانم بڵێم و ڕابگەیەنم کە ئێمە هەوەڵین کەس بووین لە بەربەرەکانی لە گەڵ ڕێژیمی خومەینی داو، لەو باوەڕەدام لە داهاتووش دا ئاخرین کەس دەبین کە بەربەرەکانیمان لە گەڵ ڕێژیمی خومەینی هەردەمێنێ.

*وتووێژی دوکتور قاسملوو لە گەڵ ڕۆژنامەی «یوم السابع»، «کوردستان» ژمارە ١٠٩*

## جێگای ژنان لە کۆماری ئیسلامی دا

لە حاڵێک دا کە ژن ئیلهامدەری هونەرمەندان بۆ خوڵقاندنی بەرهەمەکانە، تەعلیماتی کۆن و ڕزیوی خومەینی مەقامی ژنی هێناوەتە خوارو و کردوویەتی بە بوونەوەرێکی چادر بەسەر، ڕەشپۆش و بێ مایە، بوونەوەرێک کە شیاوی کۆیلەتی یە، مەجبوورە لە ماڵ دا زیندانی بێ بۆ ئەوەی خزمەتی پیاوان بکا و دوور لە کۆمەڵی پیاوان درێژە بە ژیانی خۆی بدا.

*وتاری «سەبارەت بە فەرهەنگ»، «کوردستان» ژمارە ٩٤*

## مەژی بۆ مردن بمرە بۆ ژیان

ئێمە لە کوردســـتان دەرسی نیشـــتمانپەروەری دەدەین بە خەڵک و هەرچەند داوا لە پێشـــمەگەکانمان دەکەین کە ئازایانە دژی دوژمن شەڕ بکەن و بۆ وەدەستهێنانی ئـــازادی تێ بکۆشـــن، هەر لەو کاتەش دا فێریان دەکەین کـــە چۆن بژین. چونکە ئامانجی هەرە بە نرخی ئێمە لە مردن، لە خەباتێکی زەرووری و خوێناوی دا کە بە سەریان دا سەپاوە، وەدەست هێنانی ئازادی بە مەبەستی باشتر ژیانە.

*وتاری « سەبارەت بە فەرهەنگ »، « کوردستان » ژمارە ٩٤*

## با بەخۆمان و خەباتی خۆمان پشت ئەستوور بین

لە پێش دا، با بایەخ بە هێزی بێ پایانی گەلی کورد بدەین و، لە خۆمان و خەباتی خۆمان دڵنیا بین و، وەک عامیلێکی سەربەخۆ لە مەیدانی سیاسیی وڵات دا خۆ بنوێنین، ئەو کاتە پشتیوانمان زۆر دەبێ و هەلومەرجی سەرکەوتن باشتر ئامادە دەبێ.

*لە پەیامی دوکتور قاسملوو بە بۆنەی ٢٥ ی گەلاوێژی ١٣٦٧*

## بزووتنەوەی ئێمە پێویستی به پەنا بردن بۆ تیرۆریزم نیه

من پێم وایە بزووتنەوە بە هێزەکان، ئەو بزووتنەوانەی بە ڕێگای دێمۆکراتی دا دەڕۆن و ڕێنوێنی دەکرێن و لایەنگری و پشتیوانیی خەڵکیان لە گەڵە، پێویستیەکیان بە پەنا بردن بۆ تیرۆریزم نیە. لە بارەی خۆمان دا دەبێ بڵێین، لە گەڵ ئەوی خومەینی چەندین جار دژی ئێمە لە شێوەکانی تیرۆریستی کەلکی وەرگرتوە، ئێمە هیچ کات ئەوەمان تەئیید نەکردوە و بە پەیرەوی کردن لە ئوسوول، بارمتە گرتنمان مەحکووم کردوە. لە ساڵی ١٩٧٩ دا ئێمە تەنیا حیزبی ئێران بووین کە بارمتە گرتنمان لە سەفارەتی ئەمریکا دا مەحکووم کرد. دواتریش هەمیشە تەیارە ڕفاندن و بۆمب دانانەوەمان مەحکووم کردوە. تیرۆریزم سیاسەتی ڕەسمیی کۆماری ئیسلامی یە کە بەپرسانی ڕێژیم چەند ساڵ لەمەو پێش بە ئاشکرا ڕایانگەیاندوە. ئێستا چونکە لە نێوخۆی ئێران دا لە هەر لایەکەوە هاواری ڕەخنەو ئێعتراز بەرز بۆتەوە، ڕێژیم بێ ئەوەی بە ڕەسمی قسە لە تیرۆریزم بکا، بەکاری دێنێ. بەڵام فەلسەفەی کۆماری ئیسلامی ئەوەیە و هەمیشە ئەوە بووە کە شۆڕشی ئیسلامی بە هەر شکل و شێوەیەک کە ئیمکانی هەبێ ـ با لە ڕێگای تیرۆریزمیشەوە بێ ـ بۆ دەرەوە بنێرێ.

*وتووێژ لە گەڵ هەواڵنووسی ڕۆژنامەی لیبراسیۆن، « کوردستان » ژمارە ١٢٠ ل ٨*

## هۆی پەنا بردن بۆ شەڕی پارتیزانی

کاتێک لە وڵاتێک دا سەرەڕوویی دەسەڵاتدار بێ، ئازادی یەکان پێشێل بکرێن و مافە ئینسانی یەکان بایەخیان بۆ دانەنرێ، خەڵکی ئەوینداری ڕزگاری و عەداڵەت چونکە بە هۆی بێ هێزی یەوە ناتوانن ڕاپەڕینێکی تێکڕایی یان شۆڕشێکی گشتی بۆ کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی ناوەندی وەڕێ بخەن، ڕێگایەکی دیکەیان، بێجگە لە پەنا بردن بۆ شەڕی پارتیزانی نیە.

*وتاری دوکتور قاسملوو لە ژێر ناوی « شەڕی پارتیزانی و زەبر و زەنگ »، « کوردستان » ژمارە ١٢٤*

# پێوەندی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان لەگەڵ بزووتنەوەی گەلانی ئێران

بزووتنەوەی گەلی کورد هەر چەند بە هێزیش بێ ئەو پەڕەکەی تەنیا دەتوانێ ڕێژیم لاواز و ڕێگا بۆ رووخانی خۆش بکا بەڵام هیچ کات ناتوانێ بە تەنیایی ببێتە ئاڵتێرناتیو، بۆیە ئێمــە بەردەوام هەوڵمان داوە کە پێوەندیی نێــوان گەلی کورد و بزووتنەوەکانی دیکەی ئێران بە هێز بکەین.

*وتووێژی «عاتفە گورگین» لە گەڵ دوکتور قاسملوو، گۆڤاری وەرزانەی « فصلی در گلسرخ » بەرگی سێهەم»*

## ئەوەی ئێمە دەمانهەوێ

ئێمە لەو باوەڕە داین پاش تاقیکردنەوەی دوو سەرەڕۆیی توند و تیژ واتە سەرەڕۆیی پاشایەتی و سەرەڕۆیی ڕێژیمی خومەینی کاتی ئەوە هاتوە کە ڕێژیمێکی دێمۆکراتیک لە ئێران دابمــەزرێ. ئێمە ئامادە نین لە گەڵ هیچ هێزێکی لایەنگری دیکتاتۆری هاوکار بین و هەر لە بنەڕەت را هەر چەشنە دیکتاتۆری یەک رەت دەکەینەوە. ئێمە دەمانهەوێ بو هەتا هەتایە کۆتایی بە کۆبوونەوەی دەسەڵات لە تاران بێنین .

ئێمە خوازیاری ئێرانێکی ســەربەخۆ و بێ لایەنین و لەو باوەڕە داین لەم رووەوە زۆربەی هێزەکان لە گەڵمان هاودەنگن.

*لە وتووێژی « عاتفە گورگین»، فصلی در گلسرخ «بەرگی سێهەم»*

## باوەڕی قووڵ بە دێمۆکراسی

ئێمە لە کوردستان و لە حیزبی دێمۆکرات دا باوەڕێکی قووڵمان بە دێمۆکراسی هەیە و هــەر وەها لەو باوەڕە داین : بە بێ دابین بوونی ئازادی یە دێمۆکراتی یەکان، وڵاتی ئێمە ناتوانێ ئەو کێشە و گیروگرفتە ئاڵۆزانە چارەسەر بکا کە بە دەستیانەوە دەناڵێنێ.

*بڵاوکراوەی » جامعه نوین و دمکراتیک کردستان « ژمارە یەک»*

## ئەوەی بۆ شۆڕشگێڕێك گرنگە

بە بڕوای من ئەوەی بۆ شۆڕشگێڕێک گرنگە ئەوەیە کە نابێ هیچ کات شەرمەزاری ویژدانــی خۆی بێ و دەبێ هەردەم بتوانێ ئیدیعا بکا کە ئەوەندەی بۆی کراوە و لە دەستی هاتوە، لە پێناوی شۆڕش، ئازادی و رزگاریی نیشتمانەکەی دا کردوویەتی.

## نابێ یەك هەنگاو بەرەو لە ژێر پێنانی دێمۆکراسی بڕۆین

ئێمە دێمۆکراتین و دەبێ تا ســەر دێمۆکــرات بین. نابێ لە بیرمان بچێ کە ئەگەر هەنگاوێک بەرەو لە ژێر پێنانی دێمۆکراســی بڕۆین، تازە بەرەو دیکتاتۆری رۆیشتووین و گەڕانەوە دژوارە.

## تەنیا تاوانی خەڵکی کوردستان هەڵکردنی ئاڵای خەباتە

تاوانی خەڵکی کوردستان تەنیا ئەوەیە کە ئامادە نین دان بە دەسەڵاتی سەدەکانی نێوەڕاستی ئاخوندەکان دا بنێن و لە بەشێکی نیشتمانە ئازیزەکەمان واتە لە کوردستان دا ئـاڵای خەباتیان شـەکاوە ڕاگرتوە، بۆیە کەوتوونەتە بـە ڕق و تووڕەیی لە ڕادە بەدەری خومەینی و دەست و پێوەندەکانی.

*بەشێک لە پەیامی د. قاسملوو بۆ ڕێکخراو و کەسایەتی و هاونیشتمانان لە دەرەوەی وڵات،» جامعه نوین و دمکراتیک کردستان « ژماره ٤»*

## کوردستان سەنگەری ئازادیی سەرانسەری ئێران

خەڵکی کوردستان داوای « دێمۆکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان « دەکەن، ئەوان لە بەرامبەر دەسەڵاتی کۆنەپەرستانەی ئاخوندەکان دا نەک هەر بەرگـری لە بوون و بایەخە ئینسـانی یەکانی خۆیان دەکـەن، بە ڵکوو بۆ ئازادیی سەرانسـەری ئێران تێ دەکۆشـن.ئەو شـانازی یەش بۆ هەتا هەتایە بۆ خەڵکی کوردستان دەمێنێتەوە کە لە قۆناغە هەرە سەختەکانی مێژووی هاوچەرخی وڵاتەکەمان دا کوردستانیان کردۆتە سـەنگەری ڕزگاریی سەرانسەری ئێران و بۆ پاراستنی ئەم سەنگەرەش گیانی خۆیان بەخشیوە.

# داهاتووی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی

ئەگەرچی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیی خومەینی، چ بە خومەینی یەوە و چ بێ خومەینی، ڕێژیمێکی بێ داهاتوویە، بەڵام هەڵەیە ئەگەر وا بیر بکەینەوە ] بە دوای مەرگی خومەینی دا [ زۆر زوو لە پڕ دەڕووخی. لە ڕاستی دا ئەوە ڕاستە کە ڕێژیم ئیدی پشتیوانیی زۆربەی خەڵکی لە پشت نیە، بەڵام کەمایەتی یەک کە ماوەتەوە، هەستەیەکی زۆر چڕ پێک دێنێ و لە گەڵ ئەوەش دا کە یەکپارچە و یەکدەست نیە، بەڵام قازانجی هاوبەش لێکی گرێ داون. لە نێو هەڵسووڕێنەرانی ڕێژیم دا بەرەبەرە دووقۆڵ پێک هاتوە : قۆڵی توندڕەو و... قۆڵی میانەڕەو... ئاشـــکرایە هەر یەک لەو دوو قۆڵە هەوڵ دەدا کە سەنگەرەکانی خۆی پتەوتر بکا و ئەگەر توندڕەوەکان مەبەستیان ئەوەیە کە هەر ئەم ڕێگا و شێوازە وشک و توند و نەگۆڕەی ئێستا درێژە بدەن، میانەڕەوەکان پێیان خۆشە کە هێندێک لە ئازادی یە پێشێل کراوەکان بە شێوەیەکی ڕێژەیی ( نسبـی ) زیندوو بکەنەوە و ئەو دەرگایانەی بە رووی ڕۆژئاوایان دا داخســـتوون، بەرە بەرە بکەنەوە و بەم جۆرە چارەســـەرانە، تەمەنی کۆماری ئیسلامی درێژ بکەنەوە...

*وتارێکی دوکتور قاسـملوو لە ڕۆژنامەی لۆمۆند دا – مارســی **١٩٨٢** لە گۆڤاری « روزگار نو » ژمارە **٩٠** وەرگێڕاوە.*

# خەباتگێڕانی ڕێگای ئازادی کێن ؟

خەباتگێڕانی ڕێگای رزگاریی ئێران هەر ئەوانە نین کە چەکیان لە شـــانەو لە بەرەکانی شەڕ دا دژی ڕێژیمی ئاخوندی شەڕ دەکەن، بەڵکوو تێکڕای ئەوانە کە بە گوێرەی توانای خۆیان بە گیان و دڵ بە شـــێوەی جۆراوجۆر لە بەربەرەکانی دژی ڕێژیمی ئاخوندی دا بەشدارن، تێکۆشەرانی ڕێگای ئازادین.

## دوای خومەینی...

من نازانم کە خومەینی چەندە دەژی. نێونجی تەمەن لە بنەماڵەی ئەو دا، دورووبەری سەد ساڵە. کەوابوو لەوانەیە بەو زووانە نەمرێ... بە هەر حال تا کاتێک خومەینی ماوە، پێم وا نیە ئاڵوگۆڕێک بێتە پێش. بەڵام دوای وی ئەو ڕێژیمەی ئێستا یا دەمێنێتەوە یان شەڕی نێوخۆیی ساز دەبێ. من پێم وانیە ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی پاش مردنی خومەینی هەر بەو شێوەیە کە لە دە ساڵی ڕابردوودا هەبووە، دەمێنێتەوە. بەڵام ئەوە بەو مانایەش نیە کە ڕێژیم بە خێرایی لە نێو دەچێ. چونکە کۆماری ئیسلامی لەم دەساڵە دا توانیویەتی هێندێک جێ پێ بۆ خۆی بکاتەوە و بەو ۲۵۰ هەزار پاســدار و ۱۵۰ هەزار ئاخوندەی کە لە ئیختیاری دان، ناکرێ بە شــەوێک ئەم ڕێژیمە بگۆڕێ. بەو حاڵەش ئاڵوگۆڕی گەورە روو دەدەن. چونکە ئاخوندەکان بە تەنیایی ناتوانن دەروەســتی گیروگرفتەکان بێن، بۆیە بە ناچار مل بۆ جۆرێک دێمۆکراسیی چەند حیزبی دەدەن، دیارە گرتنە بەری ئەم ڕێگایە لەوی دیکە واتە شەڕی نێو خۆیی، ئیعتیباری زیاتری هەیە. چونکە هەڵکەوت ( موقعیت ) ی ئێران لە ئاستی نێونەتەویی دا جۆرێکە کە وڵاتانی دەرەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ قازانجیــان تێ دایە و لوبنانیی کردنی ئێران، زیانێکی قەرەبوو نەکراو بە هەمووی ئەوان دەگەیەنێ.

*لە پوختەی وتووێژی دوکتور قاسملوولە گەڵ هەواڵنووسانی فەرانسەیی، ۱۵ ی سیپتامبری ۱۹۸۸*

## بەختیاریی ئینسان
## یەکەم ئامانجی سۆسیالیزم

سۆســیالیزم دەیەوێ کۆمەڵێکی وا پێک بێنێ کە ئینسان هەم لە باری ماددی یەوە و هەم لەباری رووحی و مەعنەوی یەوە،ئاسوودە دەبێ. تەواوی ئەوانەی کە سۆسیالیزمی خەیاڵییشــیان پێک دێنا و ئەوانەی پێش سۆســیالیزمیش، هەوڵیان دابوو بۆ ئەوەی کە ئینسان بتوانێ تەواوی ئیستیعدادی خۆی بە کار بێنێ لە باری ماددی و مەعنەوی یەوە ئاسوودە بێ. «هەم» لە باری ماددی یەوە ژیانێکی باشی هەبێ، هەم ئازادیی هەبێ.

## ئازادی...

هیچ نێعمەتێک لە جیهان دا لە ئازادی بەنرختر نیە. ئازادی کەرامەت و شەخسییەت دەدا بە ئینسان و، ڕێگا نادا بکرێ بە مۆرە... ئینسان دەبێ لە حاڵەتی مۆرە بێتە دەر، ببێتە شەخسییەت، ببێتە فەردێکی زیندوو و چالاکی کۆمەڵ

## ئێمە دەبێ بۆخۆمان وڵاتی خۆمان ئازاد بکەین

بەداخەوە لە ڕابردوو دا، زۆر لە تێکۆشەرانی کوردستان ئەو چاوەڕوانی یەیان هەبووە و وافێرکراون کە سۆویەتەکان دەبێ بێن و ئازادمان کەن. ئێستا حیزبی ئێمە ئەو ڕاستی یەی بۆ ئەندامانی خۆی و گەلی کورد و گەلانی دیکەی ئێران ڕوون کردۆتەوە کە ئێمە خۆمان دەبێ وڵاتەکەمان ئازاد بکەین. نابێ چاوەڕوانی ئەوە بین کە یەکیەتیی سۆویەت یا هەر کەس و هەر جێگایەکی دیکە لە دەرەوە ڕا بێ و دێمۆکراسی و خۆدموختاریمان بۆ وەربگرێ.

*بەشێک لەم وتانە کە لە ساڵیادەکانی تێرۆری د.قاسملوو لە ڕۆژنامەی«کوردستان» دا، بلاوم کردوونەوە، لە کتیبی «چەپکە بۆچوونێک لە سەر گەورە شەهیدی گەلی کورد د.قاسملوو»، ح. ماردین،١٩٩٤،چاپی سوید، هەر وەها زۆربەشیان لە کتێبی«دوکتور قاسملوو، ڕێبەرێکی مودێڕن و شۆڕشگێڕێکی دێموکرات»، دا بلاو بوونەوە.*

# سەربەخۆیی
## سەرمایەی گەورەی حیزبی دێمۆکرات

دۆستایەتی لە روانگەی ئێمەوە ئەوە نیە کە هەرچی دۆستەکانمان گوتیان، بڵێین بە چاوان ! نابێ لە بیرمان بچێ کە حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران، خاوەنی سەرمایەیەکی گەورەیە، ئەمەش هەر ئەو سیاسەتە سەربەخۆیەیە کە گرتوویەتە پێش. یەکێک لە رەمزەکانی سەرکەوتنی ئێمە هەتا ئێستا، هەر ئەم سیاسەتە سەر بەخۆیە بووە. ئەو سیاسەتە چەوت بووبێ و راست بووبێ، دەسکردی خۆمان بووە. چونکە پێمان وایە هیچ کەس بە ئەندازەی خۆمان لە واقیعییاتی کۆمەڵی کوردستان شارەزا نیە و هەر بۆیە هیچ کەس لێوەشاوەیی بڕیاردانی لە جیاتی ئێمە نیە. هیچ ئۆرگانێک، چ هی وڵاتێکی تایبەتی و چ نێونەتەوەیی، حەقی ئەوەی نیە کە لە بارەی ئێمەدا بە بێ ئێمە بڕیار بدا. هەر وەک ئێمەش ئەو هەقە بە خۆمان نادەین کە لە سەر وڵاتێکی دیکە بڕیار بدەین. نابێ قازانجی هیچ وڵاتێک و، هیچ حیزبێکی دیکە، بۆ ئێمە ببێتە میعیار، تەنیا بۆ ئێمە دەبێ قازانجی گەلانی ئێران و گەلی کورد میعیار بێ و بەس. هیچ کەسیش لە خودی گەلانی ئێران و گەلی کورد باشتر ناتوانێ ئەم قازانجە دیاری بکا.

# سەربەخۆیی بڕیاردان ،
# میعیاری بنەڕەتی بۆ حیزبی دێمۆکرات

با بە سەراحەتەوە بگوترێ کە ئێمە بە خاتری دۆستایەتی قەت واز لە سەربەخۆیی و قازانجی میللەتەکەمان ناهێنین. بەڵام لە بەر خاتری سەربەخۆیی و قازانجی میللەتەکەمان ئەگەر پێویست بوو واز لە دۆستایەتی دەهێنین. کەوابوو میعیار بۆ ئێمە قازانجی حیزب و گەلی کورد و گەلانی ئێران و سەربەخۆییمانە. میعیاری ئەساسیی سەربەخۆیی بڕیاردانە. دۆستایەتی دەکەین بەڵام لە گەڵ پاراستنی سەربەخۆیی. ئەگەر پێویست بوو دۆستایەتی یەکە فیدای سەربەخۆیی دەکەین، بەڵام هەرگیز سەربەخۆیی فیدای دۆستایەتی ناکەین.

## کردەوە و تاقیکردنەوە دەبێ
# میعیاری ڕاستی و دروستیی تیئۆری بێ

تیئۆریی زانستی لە پاوانی هیچ کەس دا نیە... هەموو کەس دەتوانێ پەرەی پێ بدا و هەموو کەسیش دەتوانێ تەتبیقی بکا و کەسیش مافی ئەوەی نیە خۆی بکا بە حەکەم. میعیاری ڕاستی و دروستیی تیئۆری، کتێب نیە. کردەوە و تاقیکردنەوەیە. تیئۆریی کۆمەڵایەتی لە جەریانی تەتبیق دا ڕاست و دروستیی خۆی نیشان دەدا. ڕاستە کە واقیعییەت سەرچاوەی تیئۆری بووە. بەڵام چونکە واقیعییەت هەمیشە لە گۆڕان دایە و هەلومەرجیش لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە فەرق دەکا تیئۆریش دەبێ بگۆڕێ. لە ئاخیرەکەی دا میعیار تیئۆری نیە، میعیار پراکتیکە و واقیعییەتە. ئەگەر تیئۆری یەک لە گەڵ واقیعییەت ڕێک نەکەوێ، واقیعییەتی ڕەق بە زۆر ناچێتە نێو چوارچێوەی تیئۆری یەوە.

## کوردان شەڕخواز نین ،
# خوازیاری سوڵح و ئاشتین

بە پێچەوانەی تەبلیغاتی دوژمنانی نەتەوەی کورد، کوردان شەڕخواز نین. ئەوان خوازیاری سوڵح و ئاشتین. بەڵام کاتێک بوون و مەوجوودییەتیان وەک نەتەوەیەک لە مەترسی دەکەوێ، دیارە بۆ دیفاع لە هوویەتی میللی و شەخسییەتی ئینسانیی خۆیان ناچارن ڕاپەڕن.

# سێ ئامانجی گەورە کە حیزبی دێمۆکرات خەباتیان بۆ دەکا

حیزبی دێمۆکرات بۆ وەدیهێنانی سێ ئامانجی گەورە پێک هاتوە و خەباتیشیان بۆ دەکا. یەکەم لابردنی ستەمی نەتەوایەتی یە. دووهەم لابردنی ستەمی چینایەتی یانی چەوساندنەوەی ئادەمیزاد. حیزبی ئێمە بۆ لابردنی هەموو چەشنە زۆرداری یەک تێ دەکۆشێ. چەوساندنەوەش، ستەمی چینایەتییش بەشێکە لە زۆرداری. هەر بۆیەش لە بەرنامەی حیزبی ئێمەدا هاتوە کە بۆ لابردنی چەوساندنەوە خەبات دەکەین بۆ ئەوە کە هەموو چەوساندنەوەیەک واتە چەوساندنەوەی چینایەتییش لە بەین بچێ.

... تەنیا نان بۆ ژیانی شایستەی ئادەمیزاد کافی نیە، دەبێ ئازادییشی لە گەڵ بێ. بۆیە ئێمە هەر لە سەرەتاوە بۆ ئازادی خەبات دەکەین. باشە ئەگەر خەڵک نەچەوسێندرێتەوە، نانی هەبێ، بە زمانی خۆی بخوێنێ بەڵام ئازادیی نەبێ بەو زمانەی خۆی نەزەری خۆی لە سەر وەزعی وڵاتەکەی دەرببڕێ مانای ئەوەیە ستەمێک ماوە کە ستەمی سیاسی یە. حیزبی ئێمە خەبات دەکا بۆ ئەوە ئەو ستەمە سیاسی یەش نەمێنێ. ستەمی نەتەوایەتی، ستەمی چینایەتی و ستەمی سیاسی هەر سێکیان ] دەبێ [ لە نێو بچن. لە بەین بردنی ستەمی نەتەوایەتی و ستەمی چینایەتی و دابینکردنی دێمۆکراسی و ئازادی، ئەوەیە ئەو کۆمەڵەی حیزبی دێمۆکرات خەباتی بۆ دەکا.

# بۆ چارەسەری مەسەلەی نەتەوایەتی لە وڵاتی ئێران دا

ئێمە دڵنیاین هەر ڕێژیمێک لە ئێران دا بە ڕاستی گەلی، دادپەروەر و دێمۆکراتیک نەبێ ناتوانێ مەسەلەی نەتەوایەتی کە یەکێک لە گیروگرفتە بنەڕەتی یەکانی وڵاتی ئێمەیە، چارە سەر بکا. ڕاستی یەکەی ئەوەیە کە لە ئێران دا گەلانی زۆرلێکراو زیاتر لە نیوەی دانیشتووانی وڵات پێک دێنن. خوێندن بە زمانی زکماکی، پاراستن و پەرەپێدانی فەرهەنگی نەتەوایەتی، لابردنی جیاوازیدانانی ئابووری و سیاسی و لە هەمووی گرنگتر، دیاریکردنی چارەنووس بە دەستی خۆیان، بەشێک لە مافە ڕەواکانی ئەو گەلانەن. لابردنی ستەمی نەتەوایەتی لەسەر ئەو گەلانە، بە پێچەوانەی ئیددیعای ژمارەیەک لە دوژمنان، هاندانی خەڵک بۆ جیابوونەوە نیە، بە پێچەوانە دابینکردنی یەکیەتیی ڕاستەقینەی ئەو گەلانە لە چوارچێوەی ئێرانێکی دێمۆکراتی دا، زامنی پاراستنی یەکیەتی و سەربەخۆیی وڵاتە.

## کۆبوونەوەی دەسەڵاتی ئێران لە تاران ، دەبێ کۆتایی پێ بێ

ئێمە ئامادە نین لە گەڵ هیچ هێزێکی لایەنگری دیکتاتۆری هاوکاری بکەین و هەر لە بنەڕەت ڕا، هەر چەشنە دیکتاتۆری یەک ڕەت دەکەینەوە. ئێمە دەمانهەوێ بۆ هەتاهەتایە کۆتایی بە کۆبوونەوەی دەسەڵات لە تاران بێنین. ئێمە خوازیاری ئێرانێکی سەر بەخۆ و بێلایەنین و لەو باوەڕە داین زۆربەی هێزەکانی ئێران لەگەڵمان هاودەنگن.

## شۆڕشگێڕێك ، نابێ هیچ کات شەرمەزاری ویژدانی خۆی بێ

بە بڕوای من ئەوەی بۆ شۆڕشگێڕێک گرنگە، ئەوەیە کە نابێ هیچ کات شەرمەزاری ویژدانی خۆی بێ و، دەبێ هەردەم بتوانێ ئیددیعا بکا کە ئەوەندەی بۆی کراوە و لە دەستی هاتوە، لە پێناوی شۆڕش، ئازادی و ڕزگاریی نیشتمانەکەی دا کردوویەتی.

## کلیلی چارەسەر کردنی دروستی گیروگرفتەکان و هۆی بەرەوپێش چوونی حیزب

پتەو کردنی یەکیەتیی سیاسی و فیکری، ئەرکێکی بنەڕەتی یە کە دەکەوێتە سەر شانی هەموو ڕێکخراوەکانی حیزب. دیارە هەموو ئەندامانی حیزب لە بارەی مەسەلە سیاسی یەکانەوە وەک یەک فکر ناکەنەوە. ئامانجیش ئەوە نیە وەک یەک فکر بکەنەوە. چونکە ئەوە نە مومکینە، نە بە قازانجی تێکۆشانی حیزبیشە. مەبەست لەو یەکیەتی یە ئەستاندنەوەی داهێنانی فکری لە ئەندامانی حیزب نیە. بوونی بیروباوەڕی جیاواز و ڕێککەوتنی دێمۆکراتیکی ئەوان کلیلی چارەسەر کردنی دروستی گیروگرفتەکان و، هۆی بەرەو پێشچوونی حیزبە.



لە ٢٢ ی پووشپەڕی ئەمساڵ دا، ٢٢ ساڵی تەواو بە سەر شەهید کرانی ڕێبەر و مامۆستای پایەبەرزی حیزبی دێمۆکرات و خەباتی ئازادیخوازانەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دا رادەبرێ.

کارەساتی تیرۆری دوکتور قاسملوو لە لایەن کۆماری ئیسلامی یەوە و، جێگا و شوێنی ژیان و خەبات و شەهید بوونی ئەو کەسایەتی یە مەزنە لە حیزبی دێمۆکرات و بزووتنەوەی نەتەوایەتیی گەلی کورد دا، لە گەڵ ئەوەش دا کە تا ئێستا بە سەدان وتاری لە سەر نووسراوە، هەڵ دەگرێ زۆر پتری لە سەر بنووسرێ.

دوکتور قاسملوو بەو خزمەتە بە نرخانەی بە حیزبی دێمۆکرات و خەباتی شۆڕشگێرانەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێرانی کردن، بەو بیروبۆچوون و ڕێوشوێن و پرەنسیپە ئینسانی، دێمۆکراتیک و بەرزانەی هێنایە نێو خەباتی ڕزگاریخوازانە و شۆڕشگێڕانە و، بەو نەخشە بێوێنە و بێهاوتایەی لە ڕێبەری کردنی حیزبی دێمۆکرات و بەرەوپێشبردنی خەباتی گەلەکەی دا هەیبوو، هەمووکات دەتوانێ سووژەو بابەتی نووسین و لێکۆڵینەوەی زانستی و ئاکادێمیک بێ.

لە بەرەبەری ٢٢ ساڵەی شەهید بوونی ئەم مامۆستا و ڕێبەرە بەتوانا و خۆشەویستەمان دا، بە باش و پێویستی دەزانم لە جیاتی چوونە سەر بوار و لایەنەکانی دیکەی پێوەندیدار بە کارەساتی شەهید بوونی دوکتور قاسملوو، ئاوڕێک لە هەڵبژاردەیەک لە بیروبۆچوون و ڕوانگەکانی بدەمەوە کە وەک هەمیشە دەتوانن ئیلهامدەر و ڕێنوێنی ڕێبوارانی ڕێگاکەی و تێکۆشەرانی حیزبەکەی بن. با ئەم وتە و بۆچوون و روانگانە، لە لێکدانەوەی هەلومەرجی سیاسی و، چۆنیەتیی بەرەوڕوو بوونەوە لە گەڵ رەوتی رووداو و ئاڵوگۆڕەکان، لە دانی بڕیاری گونجاو و دروستی سیاسی دا، لە چاو خشاندنەوە بە بەرنامە و پێڕەوی نێو خۆی حیزب دا، لە چارەسەر کردنی دێمۆکراتیک و بەرپرسانەی گیروگرفتە نێوخۆیی یەکانمان دا و، لە هەنگاو نان و خۆ ئامادە کردن بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ریسالەت و ئەرکانەی لە سەر شانی خۆمان و حیزبمانن ئیلهامیان لێ وەربگرین.

با بیرەوەریی تاڵی لە دەستدانی ئەم ڕێبەرە مەزنە، بکەینەوە بە دەرفەتێک بۆ حزووری مەعنەویی خۆی و ڕێنوێنی و ئامۆژگاری یەکانی لە کۆڕی تێکۆشەرانی حیزب دا.